# Valentines Day



## حەقیقەتی

# جەژنی ڤالانتاین

# ڕۆژی خۆشەویستی

موسوڵمانی شوێنکەوتەی سوننەت

وریابە

**من تشبه بقوم فهو منهم**

صحيح الالباني المصدر: إرواء الغليل 1269

بسم الله الرحمن الرحيم

ان الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل مضل له، ومن يضلل فلا هادي له وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لاشريك له،وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.. أما بعد :

لەم چەند ساڵەی دوای لە نێو لاوانی کوردی موسوڵمان نەخۆشیەکی زۆر ترسناك بڵاوبووەتەوە ئەتوانم بڵێم لە (ئایدز) ترسناکترە، چونکە ڕێگا خۆشکەرە بۆ بڵاوبوونەوەی ئایدزو خراپتریش، ئەویش نەخۆشی بەشداری کردنە لە جەژنەکانی گاورو خاچ پەرستان کە هەمووی زیندووکردنەوەی داب و نەریتەکانی داوێن پیسی و فەوتان و فەسادی ئەخلاقی، بۆیە دەبینین لە جەژنی ڕەمەزان و قوربان تا نیوەڕۆ ئەخەون کەچی لە جەژنی (ڤالنتاین) هەر لە بەیانەوە بەخەبەرن و تا نیوەشەو نامە ئەگۆڕنەوە ئاهەنگ ئەگێڕن و پیرۆزبایی لە یەکتر ئەکەن ئەمەش لە کەش و هەوایەکی پڕ لە تاوان و شەهەوەت بازی و داوێن پیسی و کەوتنە شوێن شەهەوەت،بۆیە زۆر بە ئاسانی دوژمنانی خوا بە ناوی خۆشەویستی مێشك و دڵی لاوەکانمان داگیر کردووە تا ئەو ڕادەیەی خەریکە بنەمای ئاینەکەی خۆیان لە یاد ئەچێ کە لەسەر بنەمای خۆشەویستی بنیات نراوە، تاوای لێهاتووە لە (٢/١٤) هەموو ساڵێك ئاهەنگ دەگێڕن و خۆشحاڵی دەرئەبڕن، بۆیە موسوڵمانی بەڕێز بەر لەوەی (ڤالنتاین) بە جەژنی بزانیت، و بەشداری بکەیت ئەم نوسراوە بخوێنەوە پاشان خۆت بە بەرپرسی لەو بڕیارەی ئەیدەیت!!!

## حەقیقەتی رۆژی (ڤالنتاین)

(ڤالنتاین) یان وەك ناویان لێناوە (رۆژی خۆشەویستی جیهانی!) یەکێکە لە جەژنەکانی رۆمانی بت پەرستەکان کە نزیکەی پێش (١٧) سەدە باو بوو لە لایان، کە بریتیە لە گوزارشت کردن لە خۆشەویستیەکی بت پەرستی کۆن، وە سەبارەت بەم رۆژە چەندین ئەفسانە گێڕدراوەتەوە کە لە لای ڕۆمانەکان بەردەوام بووە تا دوایی گەشتووەتە خاچ پەرستان ،لەوانەش:

یەکەم :-

رۆمانەکان پێیان وابوو (ڕۆمنلیۆس) دامەزرێنەری (ڕۆما) ڕۆژێك گورگێك شیری پێداوە لەگەڵ ئەم شیرپێدانە هێزو بیرکردنەوەو ڕاجوانی پێ بەخشیوە،بۆیە رۆمانەکان لە ناوەڕاستی هەموو مانگی (فبرایر)ێك لە هەموو ساڵێك جەژنیان دەگێڕا و لەو داب و نەریتانەی هەیان بو لەو ڕۆژەدا یان مەراسیمی ئەو ڕۆژە بریتی بوو لە(سەربڕینی سەگێك و بزنێك پاشان دوو لاوی بەهێزو چوار شانە جەستەی خۆیان دەکرد لە خوێنی ئەو سەگ و بزنە سەربڕاوە پاشان خوێنەکەی جەستەیان بە شیر دەشۆرد، پاشان

کۆمەڵێك زۆر لە خەڵکی لە ڕێ و ڕەسمێکی گەورە بەڕێ ئەکەوتن و ئەم دوو لاوە بە پێشی هەموویان دەکەوتن و بەڕێگەو بانەکاندا گوزەریان دەکرد، ئەم دوو لاوە دوو پارچە پێستەیان بەدەستەوە بوو دەیان سووی بەوەی کە پێ ی دەگەیشتن، ئافرەتە ڕۆمانەکانیش وەك پێشوازییەك خۆیان بەر ئەو سوینە دەخست، چونکە باوەڕیان وا بوو ئەم کارە نەزۆکی ناهێڵێ و چارەسەرە.

**دووەم:**

ڕۆمانە کۆنەکان لەسەردەمی بت پەرستیدا خۆشیان دەرئەبڕی بۆ جەژنێك کە پێ ی دەوترا جەژنی (لوبرکیلیا) وە لە جەژنە قوربانیان سەر ئەبڕی بۆ خواکانیان کە بریتی بوون لە چەند بتێك، وە پێیان وابوو ئەم (بتانە) خۆیان لە شەڕ ئەپارێزێ،بەڵام لەسەردەمی فەرمان ڕەوایی ئیمپڕاتۆری ڕۆمانی (کلودیوسی دووەم) لە سەدەی سێیەمی زاینی خاچ پەرستی گەیشتە ڕۆمانەکان.

ئەم ئیمپڕاتۆرە ژن هێنانی لە لاوەکان قەدەغە کرد بە بیانووی ئەوەی ژن هێنان سەرقالیان دەکات لەو شەڕانەی کە دەیکات وە بە بیانووی ئەوەی لاوەکان خێزاندارەکان صەبریان زۆر ترە،بەڵام (قەشە ڤالنتاین) بەرگری لەم بڕیارەی ئیمپڕاتۆر کردوو گرێبەندی ژن و مێردایەتی (عقد الزواج)ی سەربازەکانی بە دزیەوە لە کەنیسەکەیدا دەکرد، پاشان ئەوەی ئیمپڕاتۆر بەم کارەی زانی داوای لێکرد (ڤالنتاین) واز لە خاچ پەرستی بهێنێ بۆ ئەوەی

خواکـانی ڕۆمـان بپەرەسـتێ کەچـی (ڤالنتـاین) ئـەم داوایـەی ڕەتکردەوە بۆیە لە ڕۆژی (١٤ فبرایـر)ی سـاڵی ٢٧٠م شـەوی جەژنی (لوبرکیلیا) لە سێدارە درا لەو ڕۆژەوە نازناوی (قدیس: قەشە)یان پێوە نا، بۆیە خاچ پەرەستان لە جەژنی (لوبرکیلیا) بە هۆی ڕۆژی لە سێدارەدانی (ڤالنتاین) جەژنیان دەگێڕا، دواتر جەژنەکە ناو نـرا (ڤالنتـاین) وە کردیانـە ڕۆژێـك بـۆ زینـدوو ڕاگرتنـی یـادی (ڤالنتاین) کە لە پێنـاو مانـەوە لـە سـەر ئاینی خـاچ پەرەسـتان لـە سێدارە دراوە.

**سێیەم:** ئـەم ئەفسانەیە ئـەڵێ پاش ئـەوەی (ڤالنتـاین) خرایـە بەندیخانـە لـە زینـدانـدا چارەسـەری کچی پاسـەوانی بەندیخانـەی کردووە لە کوێری ڕزگاری کردووە، پاشان عاشقی کچەکە بووە و لـە ڕۆژی لـە سـێدارەدانی نامەیـەکی بـۆ خۆشەویـستەکەی نـاردووە لـە کۆتـایی نامەکەیـدا نوسـویەتی(المخلص ڤالنتـاین) بۆیـە ڕۆژی لـە سێدارەدانی کرایە ڕۆژی خۆشەویستی بە بیانوی ئەوەی لـە پێنـاوی خۆشەویستی لە سێدارە دراوە.

**چـوارەم:** ئـەڵێ پـاش ئـەوەی پرسـیار لـە (ڤالنتـاین) ئەکـەن سـەبارەت بـە خـوای ڕۆمانییـەکان (عطـارد)ی خـوای بازرگـانی و ڕەوانبێـژی و ڤێـڵ و دزی و (جـوبیتر) کـە گـەورەی خواکـانی ڕۆمانییەکانـە لـە وڵامـدا (ڤالنتـاین) ووتوویـەتی ئـەم خوایانـە

دروستکراوی مرۆڤن بەڵکو خوای حەق (عیسای مەسیحە) خوای پەروەدگار پەنامان بدات لەسەر ئەم وڵامەی لەسێدارە دراوە.

**پێنجەم:** ئەڵێ بەهۆی بانگەشەکردنی (فالنتاین) بۆ خاچ پەرەست لەسێدارە دراوە، بۆیە کراوە بە ڕۆژی خۆشەویستی !!!

**شەشەم:** لە ڕۆژی (٢/١٤) هەموو ساڵێك ڕۆمانیە کۆنەکان ناوی کچانی دێهاتەکانیان دەنووسی و دەیانخستە نێو سەبەتەیەك پاشان وەك تیرو پشك هەر کوڕێك دەستی دەبرد و پارچە کاغەزێکی لە سەبەتەکە دەردەهێنا ناوی هەر کچێکی لەسەر بووایە دەبوو خۆشەویستی تا ساڵی داهاتوو لەگەڵیا ئەبوو، بۆ ئەم مەبەستەش کارتێکی بچوکی بەدیاری بۆی ئەنارد کە لەسەری نوسرا (بسم آلهة الأم أرسل لك هذه البطاقة) واتە: بەناوی خوای دایکەوە ئەم بیتاقەیەت بۆ ئەنێرم.

**حەوتەم:** پاش ئەوەی مەسیحیەت لە ئۆرۆپا بڵاو بووە هەندێ لە قەشەکان بینیان هێشتا لە کۆمەڵێك لە دێهاتەکانی ئۆرۆپادا داب و نەریتەکانی ڕۆمانیە بت پەرەستەکان هێشتا هەر باوە لە نێو لاوەکانیان کە بریتی بوو لە نووسینی ناوی کچەکان لەسەر کاغەزی بچوك و پاشان وەك تیرو پشك ناوی هەر کچێك بۆ هەر کوڕێك دەربچوایە ئەوە دەبووە خۆشەویستی تا ساڵی داهاتوو دیسانەوە دووبارە ئەکرایەوە، بۆیە گۆڕینی ئەم داب و نەریتە

ئاسان نەبوو بە لایانەوە بۆیە بڕیاریان دا ڕستەی (بسم آلهة الأم) بگۆڕن بۆ ناوی (قەشە ڤالنتاین)، چونکە هێمای خاچ پەرستەو بەهۆیەوە زیاتر لاوان پەیوەست دەکەن بە خاچ پەرستیەوە و دواتر ناویان لێنا جەژنی (ڤالنتاین).

**تێبینی**: (قەشە ڤالنتاین) ناوێکە پەیوەست بووە بە کەسێك لە قوربانیەکانی کۆنی کەنیسەی خاچ پەرستان و وتراویشە دوو کەس بوونە.ئەم کەسە (ڤالنتاین) لە ژێر کاریگەریەکی نییە بنەمای ئەشکەنجەی (قوطی:کلودیس) لە ڕۆما مردووە، ئەمەش نزیکەی سالّی (٢٩٦)زاینی وە لەو شوێنەی مردووە لە سالّی (٣٥٠) لە ڕۆما کەنیسەیەك بنیات نراوە بۆ بەرز ڕاگرتنی یادی (ڤالنتاین).

بەم شێوەیە ئەو ڕۆژە کرا بە جەژن و لەگەلّ بەسەر چوونی کات ئەم جەژنە لە چەمکێکی بت پەرستیەوە گۆڕا بۆ چەمکی خۆشەویستی، کە گوزارشت لە خۆشەویستی یەکی دروستکراو ئەکات لەم کارەش (قەشە ڤالنتاین) کراوە بە نموونەی بالاّی و خۆبەخت کردن وە کراوە بە هێمای بانگەشەکردن و بۆ خۆشەویستی و ئاشتی.

هەروەها ئەم جەژنە ناسراوە بە جەژنی خۆشەویستی و (جەژنی ڤالنتاین) و... هتد، چونکە پێیان وایە کە (ڤالنتاین) شەفاعەت دەری خۆشەویستیانە!!!

ئەمە سەبارەت بە حەقیقەتی ئەو ڕۆژەی کە ناوی لێنراوە جەژن و زۆربەی خەڵك و موسوڵمان بە جەژنی ئەزانن!!!!

کە هیچ بنەمایەکی نییە بنەماشی هەبێت لە ئەفسانە زیاتر هیچی تر نییە ڕاستیش بێت، ئەوا :

یەکەم: پەیوەستە بە خواکانی ڕۆمانیە کۆنەکان کە بت بوونە.

دووەم: دواتر بووە بە جەژنی خاچ پەرستان و پەیوەست بووە بە خاچ پەرستانەوە.

## بــــۆ بەشـداری ئەکەین ؟

ئەمــە ســەبارەت بــە حەقیقــەت و دیــوی ڕاســتەقینەی (ڤالنتاین)مان لە چەند بۆچونێکی جیا جیا خستە ڕوو کاتی ئەوە هــاتووە لــە ڕێگــەی لێکدانــەوەی ئــەو بۆچــوونانە بەڵگــەی قەدەغــەکردنی و حیکمــەت لــە قەدەغــەکردنی (جــەژنی ڤالنتـاین) بیخەینە ڕوو لەوانەش :-

١- بنــەڕەتی (ڤالنتــاین) لــە ڕۆمانیــە بــت پەرستەکانە، کــە لــە ڕێگەیــەوە گوزارشــت لــە خۆشەویــستی ئیلاهــی بــت پەرســتی دەکەن،بۆیــە ئــەوەی بەشــداری بکــات لــە (ڤالنتــاین) لــە ڕاستیدا بەشداری دەکات لە جەژنێکدا کە بتەکانی تێدا بەرز ڕادەگیرێن، و دەپەرســترێن و خــوای پــەروەردگاریان فــەرامۆش کردووە،خــوای پەروەردگار پەنامان بدات، ئەمەش شەریکە بۆ پەروەردگار بۆیـە خوای پەروەردگار ئەفەرمووێت: ﴿إنَّهُ مَن يُشرِكْ باللهِ فَقَدْ حَرَّم

اللهُ عليه الجنةَ ومأواهُ النارُ وما للظالمين منْ أنـصارٍ﴾ (المائـدة:٧٢)، واته: بەڕاستی هەر کەس هاوبەش بۆ خوا دابنێت ئەوا بێگومان خودا بەهەشتی لەسەر قەدەغە کردووە، و جێ و شوێنی ئاگر دەبێت، وە بۆ ئەو جۆرە ستەمکارانە پشتیوان یارمەتیدەرێك نییە.

٢. سەرهەڵدانی ئەم جەژنـە لە لای ڕۆمانیـەکان پەیوەستە بە کۆمەڵێك خورافات و ئەفسانەوە، بۆیە کەسێك ژیر بێت، و باوەڕی بە خوای پەروەردگار و ڕۆژی دوایی هەبێت،باوەڕ ناکات گورگێك شیر بە منداڵێك بدات ،و هێزی پێ ببەخشێت، دواتر بێت بە دامەزرێنـەری دەوڵـەتی ڕۆمـا، ئەمـەش پێـچەوانەی بـاوەڕی موسوڵمانانە، چونکە پەروەردگار هێز دەبەخشێت نەك گورگ.

٣. لەم جەژنەدا ڕۆمانیەکان قوربانیان بۆ خواکانیان دەکرد کە (بت) بوون، بۆ ئەوەی کە خۆیان لە خراپەو مەڕو ماڵاتـەکانیان لە گـورگ بپارێزێـت، بۆیـە بەشـداری کـردن زیندووکردنـەوەی ئـەو شەرێك بڕیاردانەیە، و هاوکاریە بۆ سـەرهەڵدانەوەی بت پەرستی کە تاوانێکە هـەرگیز خـوای پـەروەردگار لێ ی خۆش نابێت، وەك فەرموویـەتی: ﴿إنَّ اللـهَ لا يَغفـرُ أن يُشرَكَ بـه ويَغفـرُ مـا دُونَ ذلكَ لمَـن يَـشاءُ ﴾ (النـساء:٤٨)، واتـە: بەڕاسـتی خـوای پـەروەردگار لـە کەسێك خۆش نابێت کە هاوەڵی بۆ بڕیـار بـدات، و جگـە لـەوەش لێخۆش بوونی هەیە بۆ هەر کەسێك کە ویستی لەسەر بێت.

٤. لە دروشمە بۆگەنەکانی ڕۆمان لەم ڕۆژەدا سەر بڕینی سەگ و بزنێکە، وەك لە چیرۆکەکاندا خستمانە ڕوو.

ئەمەش هەر گیز جێگەی باوەڕ نیە لە لای موسوڵمانی خاوەن هزر، ئاینی ئیسلامیش بە بەدوورە لەم ئەفسانە کە ناوەڕۆکی هەر هەمووی بانگەشەکردنە بۆ بت پەرستی،ئەو هەموو ڕاستیەش کە باس کران بەڵگەن لەسەر ئەوە.

٥. پەیوەست بوونی (ڤالنتاین) بەم ڕۆژە ڕای جۆراو جۆری لەسەرە،بگرە هەندێك لەسەرچاوەکان ئەڵێن (ڤالنتاین) هەر وجودی نیەو دروست کراوە، بەڵام گەر کەسێك بەناوی (ڤالنتاین)یش بوونی نەبێت یان هەبێت، ئەوا هیچ لە حەرامێتی ئەم جەژنە ناگۆڕێت، چونکە گەر بەڕاستی ئەم جەژنە پەیوەست بێ بە ڕۆژی لە سێدارەدانی (ڤالنتاین)دوە،ئەوا جەژنێکە پەیوەستە بە خاچ پەرستانەوە کە سەرتاپای (ئینجیل)یان گۆڕی و عیسای مەسیحیان ـ علیه السلام ـ بە خوا ئەزانن، بۆیە بەشداری کردن تیایدا هەر قەدەغەیە، وە ئەگەر هەر بوونیشی نەبێت ئەوا جەژنێکە لە هیچ ئایینێکدا بنەمای نیە، و بەشداری کردن تیایدا خراپترە.

تەنانەت سەردەمانێك پیاوانی ئاینی خاچ پەرستان بە قەدەغەیان زانیوە، وبە لەناو بردنی ڕەوشتی لاوان ناوزەدیان

کردووه، به خراپییان زانیوه، گەر وابێت ئەوا موسوڵمانان پێش ترن لەوەی بەشداری نەکەن.

٦- جەژن لە ئیسلامدا پەرستنێکە لە پەروەردگار نزیکمان دەکاتەوە، لە ئیسلامیشدا تەنها دوو جەژن هەیە (جەژنی ڕەمەزان و قوربان) بۆیە نابێت لە موسوڵمانان جەژنێکی تر دابهێنن لە کاتێکدا خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بە جەژنیان نەزانیوە، بۆیە بەشداری کردن لەم جۆرە جەژنانە بیدعەیە و پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرموویەتی: (من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه، فهو رد)، واتە: هەر کەسێك تازەگەری و بیدعەیەك لە ئاینەکەماندا دروست بکات بەڕووی خاوەنەکەیەوە ڕەت دەکرێتەوە.

وە خوای پەروەردگاریش ئەفەرموێت: {وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ تَفَرَّقُوا وَاخْتَلَفُوا مِن بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُولَٰئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ} (آل عمران: ١٠٥)

واتە: بە وێنەی ئەوانە مەبن کە بەش بەش و جیاواز بوون ن لەپاش ئەوەی ئەو بەڵگانەی بۆ هات، چونکە ئەوانە سزایەکی گەورەیان بۆ هەیە.

ئەمەش ئاگادارکردنەوەیەکی ڕوونە بۆ ئەوەی لە ڕێڕەوی گاورو خاچ پەرستان لابدەین کە کتێبە ئاسمانییەکانیان گۆڕیوە، زانای

پایە بەرزی ئیسلام (ابن تیمیە) فەرموویەتی: (( جەژنەکان لەو تایبەت مەندیانەن کە ئاینەکانی لە یەکتر پێ جیا دەکرێتەوە))، کەوا بوو ئەم جەژنە گاورو خاچ پەرستان لە موسوڵمانان جیا ئەکاتەوە، بۆیە قەدەغەیە لەسەر موسوڵمانان بەشداری بکەن.

٧- بەشداری کردن لە (ڤالنتاین) خۆ شوبهاندنە بە گاورو خاچ پەرستان، چونکە خۆ شوبهاندن بە کافران لەو شتانەی کە لە ئاینەکەیانە زۆر خراپترە لە خۆ شوبهاندن بە جل و بەرگ و هەڵس و کەوتیان و داب و نەریتیان.(ڤالنتاین) پەیوەستە بە ئاینی گاورو خاچ پەرستان ئاینەکەشیان یان دروستکراوە یان گۆڕا و تەحریف کراوە، هەردووکیشیان هەر ناتەواون، سەبارەت بە خۆ شوبهاندنیش خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: {وَلَئِنْ أَتَيْتَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ بِكُلِّ آيَةٍ مَّا تَبِعُواْ قِبْلَتَكَ وَمَا أَنتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْ وَمَا بَعْضُهُم بِتَابِعٍ قِبْلَةَ بَعْضٍ وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءهُم مِّن بَعْدِ مَا جَاءكَ مِنَ الْعِلْمِ إِنَّكَ إِذَاً لَّمِنَ الظَّالِمِينَ} ( البقرە:١٤٥).

واتە: سوێند بێت بە خوای پەروەردگار ئەگەر تۆ دوای ئارەزووەکانی ئەوان بکەویت دوای ئەو زانینەی (سروش) کە بۆت هاتووە بە ڕاستی ئەو کاتە تۆ لە ستەم کاران دەبیت.

زانای پایە بەرز(ابن تیمیە) سەبارەت بە ڕاڤەی ئەم ئایەتە فەرموویەتی: ((ئەم ئایەتە ئاماژە بەوە دەدات کە پێچەوانەی

کردەوەیان (واتە:گاور و خاچ پەرستان) گشتیﷺ و لە هەموو شتێکدایە)).

٨. بەشداری کردن لە (ڤالنتاین) هۆکارە بۆ نزیک بوونەوە و خۆشەویستی بێ باوەڕان کە خوای پەروەردگار ئاگاداری لێ کردووینەتەوە لە چەندین ئایەت کەوا خۆشەویستمان بۆ گاور و خاچ پەرستان نەبێ، وەك دەفەرمووێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴾(المائدة: ٥١).

واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە،جولەکەو گاور مەکەن بە پشتیوان،و خۆشەویستی خۆتان،ئەوانە هەندێکیان دۆستی یەکترن ،ئەوەتان ئەوان بکات بە دۆست، ئەوە بە ڕاستی ئەو کەسە لەوانە،بێگومان خوای پەروەردگار ڕێنموونی گەڵ ستەمکاران ناکات.

زانای پایەبەرز(ابن التیمیە) فەرموویەتی (( بنەمای دۆستایەتی (الموالاة) بریتی یە لە لە خۆشەویستی، هەر وەك چۆن بنەمای دژایەتی (المعاداة) بریتی یە لە ڕق لێبوون، چونکە دۆستایەتی (الموالاة) هۆکارێکە بۆ نزیک بوونەوە لە یەکتر،و دژایەتی و ڕق لێبوونیش (المعاداة) هۆکارێکە بۆ لە یەك دوورکەوتنەوە ،بۆیە خوای پەروەردگار ئاگاداری کردووینەتەوە لەوەی هیچ موسوڵمانێك نیە بێ باوەڕی خۆش بوێ و لەگەڵ

ئەوەشـدا خـۆی بـە موسـوڵمانی تـەواو بزانێـت، هـەروەها زانـای پایەبەرز(ابن التیمیە) پاشان فەرموویەتی ((خۆ شوبهاندن دەبێتە هۆی خۆشەویستی و حەز لێکردن و پشتیوانی کردنیان بە دۆست لە ناخدا، هەروەها خۆشەویستی ناخ دەبێتە هۆی خۆشوبهاندن لە ڕوکەشدا )).

بۆیـە نـاکرێ کەسـی موسـوڵمان خۆشەویـستی پـەروەردگارو خۆشەویستی بێ باوەڕان لە یەك دڵدا کۆ بکاتـەوە، چونکە ئـەوەی خوای خۆش بوێ رقی لە کافران و بێ باوەڕانە.

٩- ئـەو خۆشەویـستیەی لـەم جەژنـەدا بانگەشـەی بۆ دەکـەن دوورە لـە پـاکی، چـونکە بانگەشـەیە بـۆ بەسـتنی پەیوەنـدی خۆشەویستی کە حەرامە و ئەنجامدانی کارێکی ناشـەرعی ـ ئەگـەر سەرانێکی نـەزانکار بانگەشـەی بۆ بکەن بە پێویستی بزانن! یان پێشەکی بۆ ئـەو کتێبانـە بنووسـن کە بانگەشـەی بۆ دەکەن! واتـە لەسەر بنەمایـەکی ناشـەرعی بنیات نـراوە، و هۆکاریـشە بـۆ داوێـن پیسی کەوتنەوە زیناوە، چونکە مەبەست تیایدا تـەنها تێرکردنـی شەهوەتە،ئەمەش لە بنچینەکانی باوەڕی موسوڵمانی ڕاستەقینەوە زۆر زۆر دوورە.

١٠- بەشـداری کـردن لاسـایی کردنەوەیـەکی کوێرانەیـە، خـوای پەروەردگار لـە چـەندەها ئایـەت و پێغەمبەرەکـەی (ﷺ) ئاگاداری

کردووینەتەوە لەوەی کوێرانە لاسایی گاور و خاج پەرستان بکەینەوە هەروەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: " من تشبه بقوم فهو منهم" ( رواه ابو داود، وصححه العلامه الالبانی فی صحیح سنن ابی داود، برقم :٤٠٢١)، واتە: ئەو کەسەی لاسایی هەر نەتەوەو ئاینێك بکات، ئەویش لەوان دەبێت، هەروەها بەشداری کردن لە (فالنتاین) هۆکارێکە بۆ خوگرتن بەو داب و نەریتانەی کە تایبەتە بە گاور و خاچ پەرستانەوە، ئەمەش لە ئیسلام لە قەدەغەکراوەکانە.

١١- هەموو گەل و نەتەوەیەك خاوەن ئاینێکی تایبەتە بەخۆی هەموو ئاینێکیش خاوەن جەژنی تایبەتە بەخۆی وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە (ئەبوبەکر)ی فەرموو: ئەی ئەبوبەکر هەموو گەلێك جەژنی تایبەتی خۆی هەیە ئەمیش جەژنی ئێمەیە.(واتە:ڕەمەزان و قوربان)، وە هەروەها خوای پەروەردگار ئەفەرمووێ: (لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ) (سوره المائده :٤٨)، واتە: هەر یەکێك لە ئێوە شەریعەت و پەیڕەوێکی تایبەتمان پێ بەخشیون، بۆیە گەر جەژنێك تایبەت بوو بە گاور و خاچ پەرستان قەدەغەیە موسوڵمان بە جەژنی خۆی بزانێت،وەك چۆن جەژنەکانی ئێمەش قەدەغەیە لە لای ئەوان، چونکە هەر جەژنێك: داب و نەریتی خۆی هەیە.

١٢- نابێت بەشداری لە (ڤالنتاین) بکەین ،چونکە جەژنەکان لەو تایبەت مەندیانەن کە ئاینەکانی پێ لەیەك جیادەکاتەوە، کەوابوو جەژنەکان یەکێکن لە ڕوەکانی جیاکردنەوەی موسوڵمانان لە گاورو خاج پەرستان، خوای پەروەردگاریش ئەفەرمووێ ﴿إنَّ الدِّين عند اللَّه الإِسلام﴾ (ال عمران:١٩)، واتە: بەڕاستی دینی پەسەند کراو لە لای خوای پەروەردگار دینی ئیسلامە، بۆیە ئایینی ئیسلامیش (ڤالنتاین)ی قەدەغەکردووە، واتە لە لایەن خوای پەروەردگارەوە قەدەغەکراوە.

١٣- ئەو کردارو گوفتارانەی لە جەژنەکانیان ئەنجام ئەدرێ ناشەرعیە، وەك: (ڤالنتاین)ت پیرۆز بێت !!!، یان: بەناوی خوای دایك!!!!...هتد، بۆیە بەشداری کردنی موسوڵمانان زیندووکردنەوەی ئەو شیرکەیە کە لە سەرین.

١٤- تاوەکو ئێستاش نەزانراوە ـ ئەم جەژنە ـ لەسەر بنەمایەکی ڕاستەقینە بنیات نراوە یان هەمووی ئەفسانەیە، بۆیە ئەگەر جەژنی ڕۆمانیە بت پەرستەکان بێت، بۆمان نیە بەشداری بکەین چونکە بت پەرست بوون، وە ئەگەر جەژنی خاج پەرستان بێ هەر نابێت بەشداری بکەن، چونکە هیچ بنەمایەکی لە ئاینی نەصرانیەتدا نیە و گەر (عیسای مەسیح) (علیە السلام) زیندوو ببایە هەرگیز بواری بەم تاوانە نەدەدا کە دەیکەن.

١٥- گەر بە جەژنیشی نەزانین و بەشداری بکەین هەر تاوانبارین، چونکە بەشداری داهێنراوێك ـ بیدعەیەك ـ ئەکەینەوە کە تاوانە بۆیە دووجار تاوانبارین.

یەکەم: بەشداری لە جەژنێك ئەکەین کە لە خودی ئاینەکەی خۆشیاندا بیدعەیە.

دووەم: هەمان بیدعە لە ئیسلامدا قەدەغەیە.

١٦- بەشداری کردنت ڕەنگە تووشی کوفرت بکات،چونکە بەشداری کردن بە مانای ئەوە دێ خوای گەورە ئاینەکەی بە تەواوی دانەبەزاندووە، و پێغەمبەری خوایش (ﷺ) خیانەتی لە گەیاندنی ئاینەکە کردووە!!! چونکە خوای پەروەردگار لە ڕێگەی پێغەمبەرەکەیەوە (ﷺ) هەموو شتێکی بۆ موسوڵمانان روون کردووەتەوە، تەنانەت بەژداری کردن لە جەژنەکانیش، بۆیە تۆ لەبەردەم دوو وەڵامدای ئەوەیان لەوەی تر تاڵترە.

یەکەم: دەزانی حەرامەو کەچی سەرپێچی پەروەردگارت ئەکەیت، کە ئەمەش سزایەکی سەختی لە دوایە.

دووەم: وا هەست ئەکەیت کە ئاینی ئیسلام کامل نیە و قەدەغەی ئەم جەژنانەی نەکردووە و لە کاتێکیشدا خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا﴾ (سورة المائدة:٣)، واتە: ئەمڕۆ ئاینەکەتانم بۆ تەواو (کامل) کردووە و چاکە و بەهرەی خۆم بە

تەواوی ڕشتووە بەسەرتانداو ڕازی بووم کە ئیسلام ئاینتان بێت.
بزانە ئیسلامی کردووەتە ئاینمان و (جەژنی ڕەمەزان و قوربان)یشی کردۆتە جەژن بۆمان کە هەمووی خۆشەویستی و گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی، کەچی ئەمانەوێ بەشداری جەژنێکی تر بکەین کە تەنها فێری خۆشەویستی و تاوان و شەهوەت و داوێن پیسیمان دەکات!!! بۆیە نابێت بەشداری بکەین بۆیە بە دڵنیاییەوە کەسێك خاوەن هەست و نەست بێ و خۆی بە موسوڵمانێکی ڕاستەقینە بزانێت لە دوای خستنە ڕووی ئەو هەموو بەڵگەیە، لە قورئان و سونەت بە خۆی ئەڵێ بەڵێ تا ئێستا هەڵە بووم خەڵەفابووم چیتر بە ئاسانی ناخەڵەتێم بەڕاستی کەسێك خوای خۆی خۆش بوێ تەنها ئایەتێکی قورئانی بەسە، بۆ ئەوەی بیکاتە بەڵگەو لە(ڤالنتاین) بەشداری نەکات، بۆیە گەر ئەتەوێ بەشداری بکەی ئەم ئایەتە بخوێنەوە پاشان بڕیار بدە:﴿ ومن يبتغ غيرَ الإسلام ديناً فلن يقبلَ منهُ وهوَ في الآخرة منَ الخاسرين ﴾ آل عمران: ٨٥}، واتە: هەر کەسێك دوای دینێك بکەوێت جگە لە دینی ئیسلام، ئەوە لێ ی وەرناگیرێت، و لە ڕۆژی دواییدا لە زەرەرمەندان دەبێت.

# ئاگەداربە

بەڕاستی شەرمەزارییە موسوڵمان ڕقی لە خوا بێ و خۆشەویستی بۆ بێ باوەڕان بێت، دڵنیام پێم ئەڵێن ئەمە بوختانێکی گەورەیە بۆ موسوڵمانی ئەکەیت،منیش پێیان ئەڵێم: بەشداری کردنتان لە (ڤالنتاین) خۆشەویستی یە بۆ بێ باوەڕان ڕق لێبونە لە پەروەردگار ،چونکە سەرپێچی ئەکەین لەو ئایەتەی کە ئەفەرمووێ: ﴿يا أيها الذين آمنوا لا تتخذوا اليهود والنصارى أولياء بعضهم أولياء بعض ومن يتولهم منكم فإنه منهم إن الله لا يهدي القوم الظالمين﴾ {سورة المائدة:٥١}.

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان بە خواو پێغەمبەر (ﷺ)هێناوە ئەکەن گاورو خاچ پەرستان بە دۆستی خۆتان بزانن کە لەڕاستیدا ئەوان دوژمنی ئێوەن وە لە نێوان خۆشیاندا دۆستی یەکترن و هەر یەکێك لە ئێوە ئەوان بە دۆست دابنێ ئەوا ئەویش لەوانە.

ماناکەشی ڕوونە پێویستی بە لێکدانەوە نیە بەلام با پرسیارێك بکەین: گەر دوژمنێك دەعوەتت بکات بۆ ئاهەنگێك یان سەفرەیەك توخوا ئامادەی بچیت؟سوێند بە خوا ناچیت،چونکە زۆر بە ئاسانی ئەڵێت:چۆن بچم من ڕقم لێ یە و دوژمنمە گەر

ئەمە حاڵی نێوان دوو موسوڵمان بێت!!! ئەی چۆن بەشداری لە جەژنێك ئەكەی كە خاوەن و دامەزرێنەری و ناهەنگێڕانی ڕقیان لە خواو پێغەمبەرەكەیەتی (ﷺ).

ئەگەر ئەمە خۆشەویستی نەبێ بۆ گاور و خاچ پەرستان بۆچی بێ ئەمری پەروەردگارت ئەكەیت لە كاتێك پێمان ئەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ الزُّورَ﴾ {سورة الفرقان ٧٢:}

ڕەبیعەی كوڕی ئەنەس فەرموویەتی: مەبەست لەم ئایەتە جەژنی گاور و خاچ پەرستانە، باشە لەم بەڵگەیە بەهێز تر چییە؟!!! بۆیە ئاگاداربە.

با پرسیارێكی تر بكەین گەر یەكێك جگەرە كێش بێ و بڵێ خوایە لە شێرپەنجە بمپارێزە چی پێ ئەڵێ ی ؟ پێ ی ئەڵێ ی ساویلكە ،گێل،گەمژە... هتد !!!! بگرە قسەی خراپتری پێ ئەڵێ ی، بەڵام با ئەوەشمان بیر نەچێ ئەو موسوڵمانەی بەشداری لەم جەژنە بكات لەو جگەرە كێشە ساویلكە ترە كە بەدڵنیاییەوە تووشی شێرپەنجە ئەبێ، چونكە موسوڵمانان ڕۆژانە لەسەر نوێژ (١٧) جار ئەڵێن: ﴿اهدنــا الصراط المستقيم * صراط الذين أنعمت عليهمْ غيرِ المغضوب عليهمْ ولا الضالين ﴾ {سورة الفاتحة٦-٧}

واتە: ئەی پەروەردگار ڕێگای راستمان نیشان بدە و ڕێنموییمان بكە بۆ ڕێگەی ئەوانەی كە نیعمەتی خۆتت بەسەردا ڕشتوون . كە بریتین لە پێغەمبەران و پیاو چاكان و شەهیدان . وەنەشمان گەی

بەوانەی کە لێیان توڕەی کە (گاوران) و نەشمان کەی بەوانەی کە ڕێگای ڕاستیان وون کردووە کە (خاچ پەرستان)ن.

باشە چۆن داوای ڕێگەی ڕاست دەکەیت و داوا دەکەی پەروەردگار نەتکات لە گاور و خاچ پەرستان کەچی بەشداری لە جەژنەکانیان دەکەیت و بە قسەیان دەکەیت نایە بەشداری کارچ جیاوازیەکی لەگەڵ ئەو جگەرە کێشە هەیە کە داوای خۆپاراستن نەکات لە شێرپەنجە!! خۆ موسوڵمانیش داوای خۆپاراستن لە پەروەردگار نەکات و خۆیشی شوێن شەهوەتەکانی ئەوان ئەکەوێ!!!

سەرەڕای ئەم هەموو قسەیەش ڕەنگە یەکێك بڵێ هێندە قورسی مەکەرەوە ئێمە وەکو خۆشیەکی کاتی بەشداری ئەکەین،بەڵام ئەم کەسە بیری چووە بەشداری کردن بەشێکە لە خۆشوبهاندن، موسوڵمانان چاویان کوێر بووە لە ئاست ئەو فەرموودەیەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "من تشبهة بقوم فهو منهم" ( رواه ابو داود، وصححه العلامە الالبانی فی صحیح سنن ابی داود، برقم :٤٠٢١)، واتە: ئەو کەسەی لاسایی هەر نەتەوەو ئاینێك بکات، ئەویش لەوان دەبێت.

زانای پایەبەرز(ابن التیمیە) سەبارەت بە واتاکردنی ئەم فەرموودەیە فەرموویەتی: (بەشداربووان و خۆ شوبهاندن بەوان لە هەندێك لە جەژنەکانیان ئەبێتە هۆی دڵخۆش بوونیان بەو ناڕەواییەی کە لەسەرین).

باشە بەشداری کردن لە (ڤالنتاین) لاسایی کردنەوە نیە؟ زانای پایەبەرز(ابن التیمیە) سەبارەت بەم فەرموودەیە فەرموویەتی: ( ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە خۆشوبهاندن پێیان بە گشتی حەرامە).

دووریش نیە کەسانێك هەبن بڵێن هێندە کۆنە پەرست مەبە تەنها ڕۆژێکە هەموو جیهان خۆشحالە بە هاتنی !!! بەڕاستی ئەمە قسەی کەسێکی ساویلکەیە، چونکە داواکارییەکەی من ئەوەی لە ئامادە بوونی جەژنێکی کۆنە پەرستی ڕزگارتان بکەم چونکە خودی جەژنەکە هێندە کۆنە چەندین ئەفسانەی لەسەر نوسراوە،ئایا من کۆنە پەرستم یان ئەوانەی بەشداری ئەکەن لە جەژنێك کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی زۆر کۆن کە نزیکەی (١٧) سەدە پێش ئێستا باو بووە؟!!!

پاشان دوور لە هەموو شتێ سوێندت ئەدەم بە پەروەردگار ڕۆژێك خاچ پەرستێك یان گاورێکت بینیوە خۆشحاڵی دەربڕێ سەبارەت بە هاتنی جەژنی (ڕەمەزان و قوربان) کە جەژنی موسوڵمانانە؟ نەخێر.

باشە بۆ ئێمە بەشداری جەژنەکانی ئەوان بکەین ئەم ساویلکەیی یە تاکو کەی ؟

مەسەلەکە زۆر لەوە ترسناکترە کە ئێمە بە سادەیی بۆی ئەڕوانین!! ئاگادار بن موسوڵمانان داب و نەریتی بێ باوەڕان داگیری کردووین لە حیاتی پێشکەوتن و تەکنەلۆژیا جەژنێکمان

پێشکەش نەکەن سەرقاڵمان بکات و لەناومان ببات.دڵنیا بن جەژنەکانیان زۆر لە ئایدزو شێرپەنجە سەختڕو ترسناکترە، چونکە تووشی لاوەکانمان ئەبێ چونکە ئایدز دروست بووی ناهەنگەکانیانە.

ماوەتەوە بڵێم خوای پەروەردگار بە چەندین ئایەت ئاگاداری کردووینەتەوە لە مەترسی گاور و خاچ پەرەستان منیش هەندێکیانم بۆ خستنە ڕوو نۆبالی خۆتان بەسەر خۆتان چونکە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ولئن اتبعت أهواءهم من بعد ما جاءك من العلم إنك إذاً لمن الظالمين﴾ {سورة البقرة: ١٤٥}.

واتە: سوێند بێت بە خوای پەروەردگار ئەگەر تۆ دوای ئارەزووەکانی ئەوان بکەویت دوای ئەو زانینەی کە (سروش) بۆت هاتووە بە ڕاستی ئەو کاتە تۆ لە ستەم کاران دەبیت.

زانای پایە بەرز(ابن تیمیە) سەبارەت بە ڕاڤەی ئەم ئایەتە فەرموویەتی: ((ئەم ئایەتە ئاماژە بەوە دەدات کە پێچەوانەی کردەوەیان (واتە:گاور و خاچ پەرستان) گشتیە و لە هەموو شتێکدایە )).

منیش دەڵێم بۆ خۆشیەکی کاتی بەهەشت لە دەست خۆت دەرمەکەو بۆ تەنها ڕۆژێکی خۆشەویستی دۆزەخ بۆ خۆت دەستەبەر مەکە، بۆیە دڵنیا بە لەوەی کە گاور و خاچ پەرستان حەز ناکەن هیچ چاکەو خێرێک تووشی موسوڵمان بێت، وەك

خوای پەروەردگار ئەفەرمووێ: ﴿مَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَلَا الْمُشْرِكِينَ أَنْ يُنَزَّلَ عَلَيْكُمْ مِنْ خَيْرٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَاللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ﴾ {سورة البقرة: ١٠٥}

واتە: بێ باوەڕانی خاوەن پەرتووکە ئاسمانیەکان و ئەوانەی هاوبەش پەیداکارن حەز ناکەن هیچ شتێکی باشتان لە خواوە بۆ بنێردێتە خوارەوە.

بۆیە بەخیلیان دێت کە ئێمە موسوڵمانین و بە هەموو شێوەیەك لە هەوڵدان لە ڕێگای ڕاست لامان بدەن تا گەیشتە ئەوەی ئاهەنگەکانیان وەك بۆمبێکی تەوقیت کراو ڕەوانەی وڵاتی موسوڵمانان ئەکەن ئەوجا ڕێگامان بۆ خۆش دەکەن بچینە سەر بیروباوەڕەکەیان چونکە تەنها بەوە ڕازی نین کە تەنها بەشداری بکەین وەك پەروەردگار ئەفەرمووێ: ﴿وَلَنْ تَرْضَى عَنْكَ الْيَهُودُ وَلَا النَّصَارَى حَتَّى تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ {سورة البقرة١٢٠}

واتە: هەرگیز گاور و خاچ پەرستان لێتان ڕازی نابن تاکو شوێنی ئاین و ڕێبازیان ئەکەون.

پاشان چی؟ ئەوجا ڤایرۆسی بێ باوەڕی لە جەستەی لاوەکانمان ئەنێژن و دڵەکانیان ڕەش ئەکەن.بەم شێوەیەش بەبێ تەقاندنی یەك فیشەك وڵاتەکەمان دەخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە، چونکە

لاوەکانمـان قـەڵای پـارێزەری ئیـسلامن کـە لەدەسـت دەرچـوون ئەوانیش بە ئارەزووی خۆیان دێن و وڵاتمان ئەکەن ،بگرە ئەو کاتە خۆمـان دەرگایـان بـۆ ئەکەینـەوە باشە بۆچی ئەیانـەوێ داگیرمـان کـەن؟ وەڵامـی ئـەم پرسـیارەش لای خـوای پـەروەردگارە کـە ئەفەرمووێ: ﴿ودَّ كثيرٌ مِنْ أهل الكتاب لو يرُدُّونكم مِنْ بعد إيمانكمْ كفاراً حسداً مِنْ عند أنفسهم ﴾{سورة البقرة:١٠٩} واتـە: حـەزو ئارەزووی زۆرێك لە گاور و خاج پەرستان ئەوەیە کە پاشگەزتان بکەنـەوە لـە ئاینەکـەتان و بـێ باوەڕتـان بکـەن دوای ئـەوەی کـە بڕواتـان هێناوە،ئەمـە نهێنـی ئـەو داگیر کردنەیە بۆیـە ئاگادار بە بـەناوی خۆشەویـستی یـەوە داگـیرت ئەکەن،چـونکە داگیرکـەر ئەخۆشەویـستی ئـەزانێ و ئەڕەحمیـشی لـە دڵایـە... تکایـە... تکایە...تکایە...ئاگادار بە.

## کێ بەر پرسە لەم سەر لێشێوانە؟!!

کێ بەرپرسیارە لەم نەهامەتی و سەرلێشێوانە؟!! پرسیارێکەو حەق وایە لە خۆمانی بپرسین.ئەڵبەت وەڵامەکەی زۆرێکمان ئەرەنجێنێ بەڵام مادام وەڵامێکی دروست و حەقە باکم نیە وەڵامەکەیشی زۆر بە سادەی هەمووومان بەرپرسیارین لەم تاوانە گەورەیە هەمووومان هاوکاری دەکەین لەم تاوانە ناشرینە هەمووومان بەرپرسیارین: مامۆستایان خوێندکاران کاسبکاران هۆکارەکانی ڕاگەیاندن و بەڕێوەبەرانی باوکان و دایکان، چونکە لە (٢/١٤)ی هەموو ساڵێك ئەرکی مامۆستا ئەوەیە لە پۆلدا خوێندکاران ئاگەدار بکاتەوە لە مەترسی بەشداری کردن لە (فالنتاین)و حەقیقەتی ئەم جەژنی گاورو خاچ پەرستانە بۆ قوتابیان رونی بکاتەوە،ئەرکی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنە لە تەلەفزیۆن و ڕادیۆ بەرنامەی تایبەت پێش کەش بکەن سەبارەت بە لایەنە خراپەکانی جەژنی (فالنتاین) و خەڵکی ئاگادار بکەنەوە و هانیان بدەن بۆ دورکەوتنەوە لەم جۆرە ئاهەنگانە ئەرکی ڕۆژنامەو گۆڤارەکانە ئەرکی خاوەن قەڵەمەکانە بە نووسین خەڵکی لە خەونی قوڵ بێدار بکەنەوە بە مەترسیەکانی (فالنتاین) ئاشنایان بکەن ئەرکی مامۆستایانی ئاینیە لە مزگەوتەکان موحازەرات سەبارەت بە ڕۆژی (فالنتاین) بدەنەوە و ڕاستی (فالنتاین) بە خەڵکی ڕابگەیەنن و ڕونی کەنەوە کە (فالنتاین)

دژی یەکتا پەرستی و باوەڕی راستەقینەیە،دژی ئاینی ئیسلامە،

ئەرکی دایك و باوکانە منداڵەکانیان هۆشیار بکەنەوە و هانیان بدەن کە بەشداری نەکەن لە ئاهەنگی (ڤالنتاین)ر،ئەرکی هاوڕێکانە یەکتر بە ئاگا بێننەوە...هتد.

هەمووومان بەرپرسیارین خوێندەوارو نەخوێندەوار و گەورەو بچوك و هەژار و دەوڵەمەند نێرو مێ هەمووی بەرپرسیارە هەر ئەمەش وامان لێدەکات کۆمەڵێك ئەرك بکەوێتە سەرمان ئەویش هەوڵدانە بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵەیەی، چەندین ساڵە کوێرانە ئەنجاممان داوە و باکمان نەبووە چی دەبێ بەڵام کاتی ئەوە هاتووە بۆ سڕینەوەی تاوانەکانی پێشوومان کۆمەڵێك ئەرك هەیە شان بدەینە ژێری و بە دڵەوە جێ بە جێ بکەین بۆیە، ئەڵێم: وەك چۆن موسوڵمان ڕۆژانە کۆمەڵێك ئەرکی لەسەرە لە خوێندن و کارو کاسبی و دەرچوون لە ماڵ پەرەستن و... هتد.

بە هەمان شێوەش کۆمەڵێك ئەرکی تری لەسەرە لە ڕۆژی (٢/١٤) کە ئەتوانین بە ڕۆژی تاوان و سەرپێچی کردن ناوزەدی بکەین، چونکە تاوان کردن لەم ڕۆژەدا دەگاتە لوتکە، ڕۆژ ئاهەنگ گێڕان و شەویش نامەی عەشق گۆڕینەوە کە لە لاوەکانیش بپرسین ئەم سەرلێشێوانە لە پای چی ؟ لە وەڵامدا ئەڵێن: ئەمڕۆ ڕۆژی خۆشەویستی یە و لێگەڕێ با تۆزێك هەستی خۆشەویستی

دەربڕین بۆیە لە پاش خستنەڕوی حەقیقەتی (ڤالنتاین) کاتی ئەوە هاتووە ئەرکەکانمان بزانین لەم ڕۆژە کە بریتین لە :

١/ بەشداری نەکردن لە ئاهەنگەکانی ئەم ڕۆژە،چونکە پێشەوا (الحافظ الذهبي) فەرموویەتی ئەگەر خاچ پەرستان و گاوران جەژنی تایبەت بە خۆیان هەبوو، ئەوا نابێ موسوڵمان بەشداری تێدا بکات هەروەك چۆن لە ڕوگە (قیبلە) و شەریعەتەکانیان بەشداری ناکات.

٢/بەشداری نەکردن لە بڵاوکردنەوەی چاپ کراو و ئەو بابەتانەی پەیوەندی بە (ڤالنتاین)ەوە هەیە چونکە دەچێتە ڕیزی،فەرمان بە خراپەو نەهی لە چاکە.

٣/ئەگەر لە ڕێگەی تەلیفۆن یان بە نامە یان بە قسە کردن پیرۆزباییان لێکردی ئەوا زۆر بە لێهاتووانە بڵێ ئەم کارە تاوانەو جەژنی ئێمە نیە پیرۆزبایی گردن بیدعە و تاوانە.

٤/ بازرگانی نەکردن بەو شت و مەکانەی کە پەیوەستە بەم ڕۆژەوە وەك گوڵی سورو دڵی سورو میزەڵان وجل و بەرگ و کارتی ڕەنگاو ڕەنگی نامە، چونکە پارەکە حەرامەو کردنەوەی دەرگای تاوانە ئەو ڕۆژیەش خودا بیدات کەمیش بێت باشترە لەوەی لە ڕێگەی حەرامدا پەیدای بکەی با زۆریش بێت.

٥/ڕون کردنەوەی چەمکی ڕاستەقینەی ئەم جەژنە بۆ خەلکی و ئاگادارکردنەوەیان لەو تاوانەی توشیان دەبێ ئەگەر بەشداری

بکەن، و ڕونکردنـەوەی ئـەوەی کـە پێویـست دەکـات موسـوڵمان بەدوور بێ لەم جۆرە جەژن و ئاهەنگانە.

٦/بڵاوکردنەوەی ئەو نامیلکەو کتێبانەی حەقیقەتی جەژنەکە دەخەنە ڕوو وە لایەنی بۆگەنی تاوانەکان بە خەڵك دەناسێنن.

٧/ڕون کردنەوەی حەقیقەتی (الولاء و البراء) کە بەشداریکردن لە (ڤالنتاین) دەبێتە هۆی نەمانی.

٨/ڕون کردنەوەی چەمکی یەکتاپەرستی کە بەشداریکردن لە (ڤالنتاین) دەڕووشێت، ئەگەر لە ناو نەچێت، کە تەوحید لە دەست چوو بەهەشتیشمان لەدەست ئەچێ.

٩/ئاگادارکردنەوەی خەڵکی لەوەی خۆشوبهاندن بە گاور و خاچ پەرستان کارێکی ناشەرعی یە.

## ((خۆشەویستی ڕاستەقینە))

خۆشەویـستیەکی سـەیرە سـاڵی جارێـك گوڵێـك یـان نامەیـەکی بۆندار دەگۆڕنـەوە ئـەم خۆشەویـستیە سـەیر تـر لاوانـی ئـەم وڵاتـە کوێرانە لاسایی دەکەنـەوە و (ڤالنتـاین) بـە جـەژنی دەزانـن و بـەو پەڕی ساویلکەیی قەناعەتیان بەوە کردووە کە ڕۆژی خۆشەویستی یـە، قـەت لـە خۆمـان پرسـیوە ئەمـە چ خۆشەویـستیەکە لـە کەسـانێکەوە پێمـان گەیـشتووە کـە خۆشەویـستی یـان پەیوەست

کردووە بەو بتانەی ناویان لێناوە (خوا) بەمەش ئیخلاصیان لە دڵەکان کوشت، کە مەرجی قبولکردنی کردەوەکانمانە بەڕاستی ئەمە خۆشەویستی نیە بەڵکو لە بنەڕەتدا سەرلێشێوان و لە ڕێگای ڕاست دەرچونە، و تەنها شوێن کەوتنێکی کوێرانەیە، و هێنانە دی خەونی ئەو کەسانەیە کە لەگەڵ خوادا کەسی تر ئەپەرستن، وەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ومن الناسِ من يتخذُ من دونِ الله أنداداً يحبُونَهم كحُبِّ الله﴾ {سورة البقرة:١٦٥}.

واتە: ( خەڵکانێکی وا هەن کە خۆشەویستانێك بۆ خۆیان جگە لە خوا دادەنێن و خۆشەویستیان پێش خۆشەویستی خوای پەروەردگار ئەخەن و ئەیانکەن بە هاوەڵی خوای پەروەردگار.

سەیرم دێ کە موسوڵمانی خاوەن هزر لە ڕۆژی (فالنتاین) جەژن دەگێڕن کە کاتێك کە نەخوا و نە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانیان نەکردووە بە جەژن گێڕان لەم ڕۆژەدا، قەت لە خۆتان پرسیوە کێ فەرزی کردووە لەسەرمان کام خۆشەویستی ئەو خۆشەویستیەی تیایدا شەرەفی خەڵك تیایدا دەڕۆیشت دەست درێژ دەکرێتە سەر ناموسی کچان کام جەژن! ئەو جەژنەی بووەتە هۆی لە دەست چوونی لاوەکانمان و کوشتنی خۆشەویستی ڕاستەقینە.

ئەی ئەو کەسەی بە پەرۆشی چاوەڕوانی ڕۆژی (فالنتاین) دەکەیت بۆچی بە پەرۆش نیت بۆ هاتنی مانگی (ذی الحجة) کە مانگی سەفەر کردنە بۆ حەج بۆ چاوەڕوانی ڕۆژی عەرەفاتیش کە

ڕۆژی لێخۆشبوونی تاوانی دوو ساڵە بۆ ناتەوێ لە خۆشەویستی ڕاستەقینە تێبگەی ؟

ئەی ئەو کەسانەی بە پەرۆشن بۆ ڕۆژی خۆشەویستی (ڤالنتاین)ەوە فێری خۆشەویستی بن نەتەوێ لە چیرۆکی سەرگوزەشتەی (ڤالنتاین) فێری خۆشەویستی بێ؟ئەی بۆچی لە چیرۆکی پێغەمبەر (ئیبراهیم)ەوە فێری خۆشەویستی نابی کە ئامادەبوو لە پێناوی ڕەزامەندی پەروەردگاری کوڕەکەی بکاتە قوربانی ؟! ئەمەیە چیرۆکی خۆشەویستی ڕاستەقینە لەبەر خۆشەویستی پەروەردگار دەستی لە باوکایەتی هەڵگرت،بۆ پەند لەم چیرۆکە وەرناگرن؟ئەی ئەو کەسانەی شانازی بە ڕۆژی عاشقانەوە ئەکەن خۆشەویستی ڕاستەقینە لە ئیسلامدایە جیاوازییەك ناکات لە نێوان هەژارو دەوڵەمەند ڕەش و سپی گەورەو بچوك، لە خوا ترسان (تقوی) نەبێت،باشە قەد لە خۆتان پرسیوە ئایا ئێمە جەژنمان نیە وا لاسایی خاچ پەرستان ئەکەینەوە؟!! موسوڵمانی یەك خوا پەرست جەژنی موسوڵمان ئەو خۆشەویستیەی لە ئیسلامدا هەیە کە لە هیچ ئاینێکی تردا نیە ئەویش خۆشەویستی خوای پەروەردگارە کە هۆکارە بۆ خۆش بەختی و بەدەست هێنانی بەهەشت بە پێچەوانەوە خۆشەویستی (ڤالنتاین) زیاتر و زیاتر لە ئاگری دۆزەخ نزیکمان دەکاتەوە.

خۆشەویستی خوای پەروەردگار دوور کردنەوەیە لە زوڵم و تەکەبور و ئیسراف و خیانەت و فەسادی ئەخلاقی، لە کاتێکدا خۆشەویستی (ڤالنتاین) دوورکەوتنەوەیە لە تەوبەو چاکەکاری پاکی و سەبرو لە خوا ترسان.

خۆشەویستی ڕاستەقینە لە شوێن کەوتنی پێغەمبەردایە وەك خوای پەروەردگار ئەفەرموێت: ﴿قل إن كنتم تحبون الله فاتبعوني يحببكم الله ويغفر لكم ذنوبكم والله غفور رحيم﴾ {سورة آل عمران:٣١}.

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەوانەی کەلافی خۆشەویستی خوا لێدەدەن بڵێ: ئەگەر ئێوە بە ڕاستی خوای پەروەردگارتان خۆش دەوێ شوێنی من بکەون لە بەهەشتدا خوای پەروەردگار خۆشی دەوێن و لە تاوانەکانتان خۆش دەبێ.

(لااله الا الله) چەن خۆشەویستیەکی گەورەیە خوای پەروەردگار خۆشی بوێ، چۆن تەنها بە شوێن کەوتنی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کە فەرمانی پێدەکات بەوەی دووربین بین لە جەژنی گاور و خاچ پەرستان ئەڵێم ئەگەر ئەتانەوێ خوای پەروەردگار لێتان توڕە بێ ئەوا بکەونە شوێن (ڤالنتاین)و بە دەستی خۆی خۆی توشی سزای سەخت بکات لە پێناو چیش؟!! لە پێناو جەژنێکی بێ بنەما!! سەیرم دێ لەو کەسانەی لە(ڤالنتاین) بەدوای خۆشەویستی ڕاستەقینە دەگەڕێن لە کاتێکدا ئاینی

ئیسلام کانگای خۆشەویستیە، قورئـان گـەورەترین سەرچـاوەی خۆشەویستی یە، زۆر بەداخەوە خاوەن ئەم سەرچاوە بە نرخەین کەچی کۆمـەڵێك بێ بـاوەڕو خـاچ پەرەست و ئەیانـەوێ لاوانـی موسوڵمان فێری خۆشەویستی بکەن!!! لە ڕاستیدا نایانەوێ فێری خۆشەویستیمان بکـەن بـەڵکو گاڵتـە بـە عـەقڵمان ئەکـەن و ئـەو سەرچـاوە گەورەیـەی خۆشەویـستی کـە هەمانـە ئـەوان ئیيانـە ئەیانـەوێ لـە نـاوی ببـەن، بـرای لاوم خوشـکی بـە حیـشمەتم بەشـداریکردنت لـە (فالنتـاین) تـەنها مردنـی دڵـەکانمانی تیایـە و هیچی تر، دەزانی مردنی دڵی مانای چیە؟ مانای ئەوەیە ناسنامەی خۆمان لە دەست ئەدەین کە موسوڵمانین، چونکە دەکەوینە شوێن شەهوەتەکانمان ،و ئەکەوینە دوای کلاّوی با بردوو بۆیـە ئەمـەتان پێ ئەڵێم زۆر ئەترسم بچینە ڕیزی ئەو کەسانەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە بارەیانەوە فەرموویەتی:

" إنّمـا أخـشى علـيكُمْ شـهوات الغـيّ فـي بطـونكُم، وفـرُوجكُمْ ومضلات الهوى" ( رواة احمد والطبراني والبزار، وصححة العلامة الالباني في صحيح سنن الترغيب والترهيب، برقم :٢١٤٢)

واتە: تەنها لەوە دەترسم لە سەرتان کە تووشی ئارەزووەکان بن کـە بـە هۆیانـەوە گـومرا دەبـن، بـەهۆی ئارەزووەکـانی سـکتان ئارەزووەکانی داوێنەوە، لەگەڵ گومڕاییەکانی ئارەزوو.

(ڤالنتاین) جەژنی ئەو کەسانەیە خوای پەروەردگار لێیان توڕەیە،دەتا لە دونیاو زیندون پەشیمان ببنەوە بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان لە قیامەتدا (ڤالنتاین) هیچی لە دەست نایەت بۆتان بکات،ئەوجا ئەچیتە ڕیزی ئەو کەسانەی کە پەروەردگار لە بارەیانەوە ئەفەرمویت: ﴿يا ويلتى ليتني لم اتخذ فلانا خليلا ﴾ {سورة الفرقان: ٢٨} .

واتە: وەی بە حاڵم خۆزگە فلانە کەسم نەکردبایە بە هاوەڵی خۆم لە ئاینی دوورخستمەوە دوای ئەوە کە پێم گەیشت.

ئایا پاش ئەو هەموو لێکدانەوەیە هەر شوێن هەواو ئارەزوی پوچەڵی خاج پەرستان بکەی؟!!

ئەمەیە حەقیقەتی ئەو ڕۆژەی ناویان لێناوە (ڕۆژی خۆشەویستی!!!) کوڕانمان فێر ئەکەن گوڵی سورو نامەی ڕەنگاو ڕەنگ بدەن بە کچان و عەشق ئاڵ و گۆڕ بکەن!!! باشە ئەی کوڕان کە(ڤالنتاین) فێری ئەمەی کردن ڕازین کوڕی تریش وا لەگەڵ خوشکەکانتان بکات!! نامەی عەشقی بۆ بنێری گەر ڕازین ئەمە نزمترین پلەی ڕەوشتە گەر ڕازیش نەبیت بە هەمان شێوە هیچ جیاوازییەکی نیە، ئەمە ئەو خۆشەویستیەیە کە (ڤالنتاین) فێرمان دەکات لەوەتەی لە دوای ئەم جۆرە خۆشەویستی بە کەوتوین خیانەت زۆر بووە و ڕاستگۆی کەم بۆتەوە، چونکە خۆشەویستی ڕاستەقینە ڕو لە نەمان و فەوتانە،بۆیە کاتی ئەوە

هاتووه به گاورو خاچ پەرستان بلێین: جەژنی خۆتان بۆ خۆتان، چونکە جەژنی موسوڵمانان هەموی خۆشەویستی یە، وە کاتی ئەوە هاتووە خۆشەویستی ڕاستەقینە لە خۆشەویستی دەستکردی مرۆڤ جیا بکەینەوە، بۆیە ئامانەوێ خۆشەویستی بکرێتە جەژن بۆمان،چونکە ژیانی موسوڵمانان هەموی خۆشەویستی یە و پێویستی بەوە نیە لە ساڵێکدا یەك ڕۆژ تەرخان بکات بۆ خۆشەویستی چ خۆشەویستیەکیش؟ خۆشەویستیەکی ناشەرعی!!!

بەڕاستی موسوڵمان پێویستی بە ڕۆژێکی دیاریکراو نییە بۆ خۆشەویستی، هەموو ڕۆژێکی موسوڵمان جەژنی خۆشەویستی یە، خۆشەویستی پەروەردگارو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئایا ئەمە جەژن نیە؟! خۆشەویستی دایك خۆشەویستی خوشك و برا خۆشەویستی ئاین ئایا ئەمانە هەمووی جەژن نین؟ خۆشەویستی ژن ومێرد.....هتد، هەموو ئەمانە جەژنی موسوڵمانانن بۆیە خۆشەویستی هێندە بچوك نیە لە ڕۆژێکدا کورت بکرێتەوە، ئەوەش بە دڵەوە حەقیقەتی (ڤالنتاین)ی خوێندبێتەوە بۆیە دەرئەکەوێ کە (ڕۆژی ڤالنتاین) ڕۆژی دروستکردنی ڕقە نەك خۆشەویستی، ڕۆژی تاوانە، جەژنی ئابڕووچون و لەکەدار کردنی شەڕەفە، جەژنی لە ئاگری دۆزەخ نزیك بوونەوەیە، بۆیە ئەمانەتان ئەخەمە پێش چاو ئەوەك دوژمنانی خوا بەناوی

خۆشەویستی یەوە بتانکەنە مەقاشێك بۆ ئەوەی دەستی خۆیان نەسوتێ.ئەم جەژنــەش وەك ڕون و ئاشـکرایە زیندووکردنــەوەی یادی کەسێکە ژیان بە خۆشەویستی بەسەر بردووە خۆشەویستی یەکی نا شەرعی .ئەم جەژنە زیندوو کردنەوەی داب و نەریتی ڕۆمانیە بت پەرستەکانە بەڵام لە پۆشاکێکی نوێ ی خاچ پەرستیدا.

بەشداریکردنی موسوڵمانان لەم جەژنە هۆکارە بۆ هاتنەدی ئەو خەونەی دوژمنانی خوا کە چەندین ساڵە خەونی پێوە دەبینن ئایا هاوکاری دەکەیت لە هاتنەدی خەونی دوژمنانی خوا و مرۆڤایەتی؟

وەرن با پێکەوە شانازی بە ئاین و جەژنـەکانی خۆمانـەوە بکەین چۆن ئەوان شانازی بە جەژنـەکانی خۆیانـەوە دەکەن و گاڵتـە بـە جەژنـەکانی ئێمـە دەکـەن، بەڕاسـتی شـوورەییە بـۆ موسوڵمانان بەڕاستی (ڤالنتاین) تەنها بریتی یە لە خۆشەویستی یەکی دروستکراوی مرۆڤ ج مرۆڤێکیش مرۆڤێکی خاچ پەرست کە دواتر ئەکرێتـە خـوای خۆشەویستی ئایا موسوڵمانان ئامادەن لە (٢/١٤) ئەم خوایە بپەرستن و لە جەژنەکەیدا بەشداری بکەن؟ یان ئەڵێین تا ئێستا بێ ئاگابووین خەڵەتاو بووین چیتر نابێتە یاری دەستی ئێوە جەژنی خۆتان بۆ خۆتـان جـەژنی خۆمـانیش بۆ خۆمان.

موسوڵمانی بەڕێز وشەی خۆشەویستی زۆر لەوە گەورە ترە لەڕۆژێکی وەکو (ڤالنتاین) گوزارشتی لێبکەین وەرن با فێر بین خوا و پێغەمبەرەکەیمان (ﷺ) خۆش بوێ، وەرن با یەکترمان خۆش بوێ و درۆ لەگەڵ یەك نەکەین خیانەت لە یەك نەکەین، وەرن با دەست درێژی نەکەینە سەر یەك، ئەوە خۆشەویستی ڕاستەقینەیە، بۆیە تەنها ئەڵێم (ڤالنتاین) جەژنێکی کۆنی ڕۆمانیەکانە لە پۆشاکێکی نوێ ی خاچ پەرەستیدا کە هیچیان لەوی تر باشتر نیە، ئیتر لە کوێ ئەتەوێ بەدوای خۆشەویستی دا بگەڕێیت، لای بت پەرەستان کە جۆرە خوایەك دەپەرستن کە دروستکراوی خۆیانە، یان لای خاچ پەرەستان کە (عیسا)ی کوڕی (مەریەم) بە خوا ئەزانن خوای پەروەردگار پەنامان بدات .

ئەوەشت لە یاد ئەچێت ئەمانەی کە ئەیانەوێت موسوڵمانان فێری خۆشەویستی بکەن پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە بارەیانەوە فەرموویەتی: " والذي نفسي بيده لا يسمع رجل من هذة الأمة ولا يهودي ولا نصراني ثم لم يؤمن بي إلا كان من أهل النار". صححه العلامه الالبانى فى الصحيحه برقم :١٥٧)

واتە: سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە هیچ کەسێك نابێت لەم ئوممەتە گاور بێت و خاچ پەرستان کە هەواڵی هاتنی پێبگات و باوەڕ نەهێنێ بەوەی کە خوای پەروەردگار بۆی ناردوم بە دڵنیاییەوە تاهەتایە لە دۆزەخدایە.

ئەمانە ئەو کەسانەن کە خۆشەویستی فێری ئێمە دەکەن نەك باوەڕیان بە پێغەمبەرەکەمان نیە(ﷺ) بەڵکو گاڵتەشی پێ دەکەن ئیتر چ خۆشەویستیەك فێری ئێمە نەکەن؟!!! دڵنیابە هیچ جۆرە خۆشەویستیەك لە خەڵکی دۆزەخەوە فێر نابین، چونکە یەکێك باش بێت لە خەڵکی، دۆزەخ نابێتە جێگای، کەسانێکیش خەڵکی دۆزەخ بن چاوەڕوانی شتی باشیان لێ ناکرێت بۆیە ئاگەدار بە گاور و خاج پەرستان بێ باوەڕن و خەڵکی دۆزەخن و بەو جۆرە خۆشەویستیە ئەیانەوێ بۆ لای خۆیان بمانبەن و دواتر بەرەو دۆزەخ بمانبەن، چونکە پێیان ناخۆشە موسوڵمانان بە هەشتی بن و خۆیان دۆزەخی بن، جا ئەگەر ئەتەوێ لە جەژنی خەڵکی دۆزەخ بەشداری بکەیت ئەوا خۆت بەرپرسیاری لەوەی بەسەرت دێت! چونکە پێت خۆش بێت و پێت ناخۆش بێت (فالنتاین) جەژنی خەڵکی دۆزەخە.

# "ووێنەی کۆتایی"

هەروەك باسمان كرد (ڤالنتاین) جەژنی موسوڵمانان نیە بەشداری كردنیشی لەم ڕۆژە حەرامە ئەویش بەخستنەڕووی ئەو هەموو ئایەت و فەرموودانەی خستمانە ڕوو، بەم شێوەیەش ئەم جەژنەو جەژنەكانی تری گاور و خاچ پەرستان دەبنە كۆسپێكی گەورە لە بەردەم خۆشەویستی ڕاستەقینە،بۆیە من نامەوێ موسوڵمانان لە خۆشەویستی ڕاستەقینە

بێ بەش بن، بەڵكو مەبەستم ئەوەیە ئاگاداریان بكەمەوە لەم خۆشەویستی یە دروستكراوەی دەستی كافران، ئەمەوێ لە ڕێگەی قورئان و فەرموودەوە فێری خۆشەویستیان بكەم، وەك ئەو فەرموودەیەی كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تیایدا فەرموویەتی: "والذي نفسي بيده لا تدخلوا الجنة حتى تؤمنوا , ولا تؤمنوا حتى تحابوا , أفلا أدلكم على شيء إذا فعلتموه تحاببتم أفشوا السلام بينكم" (صححه العلامة الألباني في صحيح سنن ابي داود برقم :٥١٩٣)

واتە: سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە بەهەشت بەدەست ناهێنن تا باوەڕ نەهێنن، وە باوەڕ ناهێنن تاكو یەكتان خۆش نەوێت، ئایە ڕێنموێتان نەكەم بۆ كردەوەیەك ئەگەر ێوە ئەنجامی

بدەن دەبێتە هۆی خۆشەویستی لە نێوانتاندا؟! لە نێو خۆتاندا سڵاو لە یەکتر بکەن.

ئەمەیە خۆشەویستی ڕاستەقینە، بەڵام بەداخەوە خۆشەویستی کراوە بە هۆکارێک بۆ بەجێ هێنانی پیلانی بت پەرستی و تێرکردنی شەهوەت تا ئەو ڕادەیەی بێ باوەڕان خۆشەویستیان پەیوەست کردووە بە چەند ئەفسانەیەکەوە کە مرۆڤی ژیر هەرگیز باوەڕی پێ ناهێنێ زۆر بەداخەوە پیاوانی کۆنی کەنیسە خاج پەرستان بەرهەڵستی ئەم جەژنە بوون و پێیان وا بوو ڕەوشتی لاوەکان خراپ ئەکا،کەچی موسوڵمانان بە جەژنی ئەزانن و ئاهەنگ ئەگێڕن!!!

بۆیە لە کۆتایی ئەی ئەو کەسانەی خۆشحالن بە هاتنی ڤالنتاین...ئەی ئەو کەسانەی نامەی عەشق و خۆشەویستی لەم ڕۆژە ئەگۆڕنەوە... ئەی ئەو کەسانەی بە گوڵی سور پێشوازی لە هاوڕێکانتان ئەکەن... ئەی ئەو کەسانەی ئاهەنگ ئەگێڕن لە ڕۆژی ڤالنتاین و جلی سوور لەبەر ئەکەن؟!!

ئاگادار بن ئەم کارە دیوێکی تەواوی خاچ پەرستی ئەنوێنێ، ئەمە ڕازی بوونە بەو ناشەرعییەی کە لەسەرین، ئەوانەش کە خستمانە ڕوو بەڵگە بوون لەسەر ئەوەی ئەم ڕۆژە (ڤالنتاین) ڕۆژی گوزارشت کردنە لە خۆشەویستی (بت پەرستی) و کۆنە پەرستیە، بۆیە ئەی موسوڵمانی یەکتاپەرست ئێستا زانیت کە ڕۆژی

(ڤالنتاین) جەژنی موسوڵمانان نییەو بۆمانیش نیە بە جەژنی بزانین بۆیە لەسەر ڕێچکەو ڕێبازی موسوڵمانی خۆت بمێنەوە و خۆت پەیوەست بکە بەو دوو جەژنەی کە هەمانە (ڕەمەزان و قوربان).

ئەم کارەش لە بنەڕەتەکانی پەرەستنەکانتە، بۆیە تەنها ئەڵێم ئاخۆ کەسێك هەیە هەر بە جەژنی بزانێ و بەشداری تێدا بکات؟!!! ﴿إن أريدُ إلاّ الإصلاح ما استطعت﴾.

واخردعوانا ان الحمد لله رب العالمين

**رەوەند عبدالله**